# ناساندنی خاوەنی نامە

ناوی: الضحاك بن مزاحم شجاع الهلالي.

نازناوی: أبو محمد.

وەفاتی: ١٠٥ هیجریی.

وەصفی زانایان لەسەری:

- أحمد بن حنبل دەڵێت: ثیقەی باوەڕپێکراوە.
- سفيان الثوري دەڵێت: تەفسیر لەم چوارە وەربگرن: سعيد بن جبير، مجاهد، عكرمة، الضحاك.

سەرچاوەکانی ژیاننامەکەی:

- تهذيب الكمال (٢٩١/١٣)
- السير (١٧٣/٨)

سەرچاوەی نامەکەی:

ئەم نامەیە دەرهێنراوە لە کتێبی (الإبانة الكبرى) ی ابن بطة العكبري.



شایستەترین وتە بەندە دەستی پێ بکات سوپاسکردنی الله و وەصف کردنیەتی.

١. سوپاس بۆ الله، سوپاسی دەکەین و وەصفی دەکەین لەسەر ئەوەی هەڵی بژاردین بەوەی هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام، وە قورئانی فێرکردوین، وە منەتی خستۆتە سەرمان بە محمد ﷺ، وە دینی الله ئەوەی پێغەمبەرەکەی پێوە ناردووە بریتیە لە ئیمان، ئیمانیش بریتیە لە ئیسلام، وە نێردراوەکانی پێش خۆی پێوە ناردووە، الله دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴿٢٥﴾﴾ [الأنبياء:٢٥].

٢. ئەویش ئیمان هێنانە بە الله، وە ڕۆژی دوایی، وە فریشتەکان، وە کتێبەکان، وە پێغەمبەران، وە بەڕاستخستنەوە، وە داننان بەوەی هاتووە لەلایەن الله ەوە، وە خۆبەدەستەوەدان بۆ حوکم و کارەکانی، وە ڕازیبوون بە قەدەرەکەی.

٣. وە ئەوە ئیمانە، وە هەرکەس بەو شێوە بێت ئیمانی تەواوە، هەرکەس ئیماندار بێت خوێن وماڵی حەڕامە، وە ئەو مافانەی بۆ واجب دەبێت کە واجب دەبێت بۆ موسڵمانان، وە ئەو ئەحکامانەی لەسەر واجب دەبێت کە واجب دەبێت لەسەر موسڵمانان، بەڵام پاداشتەکەی بۆ واجب

نابێت، کەرامەت بەدەست ناهێنرێت ئیللا بە کارکردن تێیدا، واجب بوونی پاداشتی ئیمان کارکردنە پێی، وە کارکردن پێی گوێڕایەڵی کردنی الله یە لە جێبەجێکردنی فەرزەکاندا، وە دوورکەوتنەوە لە حەڕامەکان، وە شوێنکەوتنی پیاوچاکان، وە نوێژکردن، وە زەکات دان، وە ڕۆژووی ڕەمەزان، وە حەج کردن ئەگەر توانا هەبوو، وە پارێزگاریکردن لەسەر ڕۆشتن بۆ جومعە، وە جیهادکردن لە پێناو الله، وە خۆشۆردن لە لەشگرانی، وە پاکوخاوێنی، وە دەستنوێژێکی جوان بۆ نوێژ، وە پاکڕاگرتنی، وە چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک، وە سیلەی ڕەحم، وە ئەو پەیوەندییەی الله فەرمانی کردووە بیگەیەنیت، وە ڕەوشت جوانی لەگەڵ هەڵەکاران، وە چاکە بەخشینەوە بە نزیکەکان، وە زانینی مافی هەموو خاوەن مافێک لە باوک، دایک، منداڵ، نزیک، هەتیو، هەژار، ڕێبوار، داواکەر، خۆشەویست، نوسەر، دراوسێ، هاوڕێ، کەنیزەک، وە فەرمانکردن بە چاکە، وە ڕێگریکردن لە خراپە، وە خۆشویستن لەپێناوی الله، وە ڕق لێبوونەوە لەپێناوی الله، وە دۆستایەتی کردنی دۆستەکانی، وە دوژمنایەتی کردنی دوژمنەکانی، وە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە، وە گوێڕایەڵی کاربەدەستان لە تورەیی و ڕازی بوون، وە وەفاکردن بە بەڵێن، وە ڕاستگۆیی، وە وەفاکردن بە نەزرەکان، وە جێبەجێکردنی بەڵێنەکان، وە پاراستنی ئەمانەت لە شاردنەوەی نهێنی یان ماڵ، وە گەڕاندنەوەی ئەمانەت بۆلای خاوەنەکانی، وە نوسینی قەرز بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە شاهیدی دوو کەسی عەدل، وە شاهیدی دان

لەسەر فرۆشتن، وە وەڵامدانەوەی بانگکەر بۆ شاهیدی دان، وە نوسینی بە عەدل وەک ئەوەی الله فێری کردووی، وە پیادەکردنی شاهیدی لەسەر ڕووی خۆی بە عەدل گەر بێتو لەسەر حسابی نەفس و دایک و باوک و نزیکەکانیش بێت، وە وەفاکردن بە پێوانە، وە میزان بە عەدل، وە یادکردنی الله لەکاتی کارە قورسەکاندا، وە یادکردنی الله لەهەموو کاتێکدا، وە پاراستنی نەفس، وە داگرتنی چاو، وە پاراستنی داوێن، وە پاراستنی ئەندامەکان هەموویان لە حەڕام، وە قوتدانەوەی توڕەیی، وە وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکە، وە ئارامگرتن لەسەر ناخۆشیەکان، وە مەبەست لە توڕەیی و ڕازی بووندا، وە مامناوەندی لە ڕۆشتن و کاردا، وە تەوبەکردن بۆلای الله لە نزیکترین کات، وا داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانەکان، وە ناسینی حەق و ئەهلەکەی، وە ناسینی عەدل کاتێک خاوەنەکەی دەبینیت، وە ناسینی ستەم کاتێک خاوەنەکەی دەبینیت بۆئەوەی ئینسان بیناسێت لە نەفسی خۆیدا ئەگەر ئەو کارەی کرد، وە پاراستنی سنورەکانی الله، وە گەڕاندنەوەی ئەوەی ناکۆکی تیایە لە حوکم یان جگە لەو بۆلای شارەزاکەی، وە تێپەڕین لەسەر ئەوەی ناکۆکی لەسەر نیە لە قورئان و سوننەتی ڕابردوو لەبەرئەوەی حەقە و گومانی تیا نیە، وە گەڕاندنەوەی شتێک کە گومانی لەسەرە بۆلای زانایان ئەوانەی هەڵیان هێنجاوە، وە وازهێنان لەوەی گومانی لەسەرە بۆ ئەوەی گومانی لەسەر نیە، وە وەرگرتنی مۆڵەت بۆ چوونە ماڵ وە نەچوونە ماڵ تا وەرگرتنی مۆڵەت و سەلام کردن لە

ئەهلەکەی پێش ئەوەی سەیری ماڵەکە بکەیت یان گوێی بۆ بگریت، ئەگەر کەسی لێ نەبوو ناچیتە ژوورەوە بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، ئەگەر وتیان بگەڕێرەوە، گەڕانەوە باشترە، ئەگەر مۆڵەتیان دا ئەوا چوونەژوورەوەت حەڵاڵە، ئەمما ئەو ماڵەی کەسی تێدا نیشتەجێ نابێت و تێیدا شتی سوود بەخش هەیە بۆ ڕێبوار یان جگە لەو کە پشووی تیا بدات و سوودی لێ وەربگرێت پێویست بە مۆڵەت ناکات، وە مۆڵەت وەرگرتنی کەنیزەک بچوک یان گەورە، وە کاتی خەوی ئەهلی ماڵەوە سێ کات لە شەو و ڕۆژدا: کۆتاییەکانی شەو پێش فەجر، وە کاتی قەیلولە کاتێک گەورەی ماڵ بەتەنیایە لەگەڵ خێزانی، وە لەدوای نوێژی عیشا کاتێک گەورەی ماڵ و خێزانەکەی دەچنە جێگانیان، وە منداڵ بیەوێت لەکاتی خەو بچێت ئەوا پێویستە مۆڵەت وەربگرێت لەو کاتانە، وە دوورکەوتنەوە لە کوشتنی نەفسێک کە الله حەڕامی کردووە ئیللا بە حەق نەبێت، وە دوورکەوتنەوە لە خواردنی ماڵی خەڵکی بە باطل ئیللا بازرگانی پێوە بکەیت و ئەوانیش ڕازی بن، وە دوورکەوتنەوە لە خواردنی ماڵی هەتیو بە ستەم، وە دوورکەوتنەوە لە خواردنەوەی مەی، وە دوورکەوتنەوە لە خواردنی حەڕام لە خواردن و خواردنەوە، وە دوورکەوتنەوە لە خواردنی ڕیبا، وە دوورکەوتنەوە لە خواردنی قومار و ڕەشوە و داگیرکاری، وە دوورکەوتنەوە لە فێڵ و ستەم، وە دوورکەوتنەوە لە گرتنی ماڵ، وە دوورکەوتنەوە لە پەیداکردنی ماڵ بە جگە لە حەق، وە دوورکەوتنەوە لە زیادەڕۆیی و ماڵ سەرف کردن، وە

دووركەوتنەوە لە کەموکوڕی جگە پێوانە و میزان وە لە پێوانە و میزانیش، وە دووركەوتنەوە لە شکاندنی گرێبەست، وە خۆداماڵین لە پێشەوایان، وە دووركەوتنەوە لە غەدر و تاوان وە دووركەوتنەوە لە سوێندی تاوان، وە دووركەوتنەوە لە سوێندخواردن بۆ تاوان، وە دووركەوتنەوە لە درۆکردن، وە زیادکردن لە کاتی گێڕانەوە، وە دووركەوتنەوە لە شاهیدی درۆ، وە دووركەوتنەوە لە قسە هەڵبەستن، وە دووركەوتنەوە لە تۆمەت هەڵبەستن بۆ ئافرەتی داوێن پاک، وە دووركەوتنەوە لە توانج گرتن و عەیب گرتن، وە دووركەوتنەوە لە ناووناتۆرە لێنان، وە دووركەتنەوە لە قسەهێنان و پشتگوێخستن، وە دووركەوتنەوە لە جاسوسی، وە دووركەوتنەوە لە گومانی خراپ بردن بە پیاوچاکان و ئافرەتانی چاک، وە دووركەوتنەوە لەسەر بەردەوامێتی لەسەر تاوان و بەکەم سەیرکردنی، وە خۆپارێزی لە ڕێگریکردن لە یارمەتییەکان، وە خۆپارێزی لە دووركەوتنەوە لە حەق، وە خۆپارێزی لە بەردەوام بوون لە سەرپێچی و کەمتەرخەمی لە هیدایەت، وە خۆپارێزی لە خۆبەگەورەزانین و شانازی، وە خۆپارێزی لە تاوانەکان، وە ڕووبەڕووبونەوە بەشەڕ، وە خۆپارێزی لە سەرسام بوون بە نەفس، وە خۆپارێزی لە خۆشی، وە خۆپاکڕاگرتن لە قسەی ناشرین، وە خۆپاکڕاگرتن لە فاحیشە و وتەی خیانەت، وە خۆپاکڕاگرتن لە ڕەوشتی ناشرین، وە خۆپاکڕاگرتن لە میز و پیسایی هەمووی.

٤. ئەمە شێوازی دینی الله یە کە بریتیە لە ئیمان، وە لەوەی الله شەرعاندوویەتی تیایا بە دانپێدانان بەوەی هاتووە لەلایەن الله ەوە وە ڕوونی کردۆتەوە حەڵاڵ و حەڕام و فەرزەکان و سوننەتەکانی.

وە ناونراوە بۆتان بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن لە ناوخەڵکیدا ئەی خاوەن ژیرییەکان، وە لەسەروو هەموو عیلمێکەوە شارەزاتر هەیە، وە هەموو ئەمانەی کۆکردۆتەوە وەکو تەقوا.

تەقوای الله تان هەبێت، دەستبگرن بە پەتەکەی، هیچ هێزێک نیە جگە بە الله نەبێت.

داواکارم لە الله ئێمە و ئێوەش تەوفیق بدات بۆ ڕازی بوون و بەهەشتەکەی بەوەی دەیگەیەنین.

